# حوكمی درێژكردنەوەی ڕیش و لابردنی سمێڵ

لەبەر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە صەحیحەكان

تەخریجی فەرموودەكان لەسەر پەرتوكەكانی
زانای پایەبەرز شیخ محمد بن ناصر الدين الالبانی كراوە
رەحمەتی خوای لێبێت


دانانی

ئیمام عبدالله

# حوکمی

# دانان و درێژ کردنەوەی

# ڕیش و لابردنی سـمێڵ

## لەبەر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە صەحیحەکان

دانانی
ئیمام عبداللّە

تەخریجی فەرموودەکان لەسەر

پەرتوکەکانی شێخ محمد بن ناصر الدین الالبانی کراوە

ڕەحمەتی خوای لێ بێت

بسم الله الرحمن الرحيم

# باسی یەكەم

# تاشین و كورت كردنەوەی ڕیش

ئێستا بۆتە شتێكی باو لەناو زۆربەی پیاواندا كە ڕیشیان دەتاشن، ئەویش لەبەر جوانی و دەركەوتن و ناسینی بە كەسێكی پێشكەوتو خواز ... بەلاّم ئەم بەڕێزانە ڕەنگە نەزانن كە جوانی پیاوان بە ڕیشیانەوەیە ، وەك عەرەب دەڵێن : ((زينة الرجال بلحاهم))، هەروەها واجبێكە لە واجبە شەرعییەكان ، كە نیشانەیەكە لە نیشانەكانی پیاوەتی (رجولەت) و فیطرەتی مرۆڤی نێرینەیە ، كە خوای گەورە لەسەری بەدی هێناوە ... وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خاوەن ڕیشێكی زۆر و پڕ بووە و هیچ كاتێك لە ژیانی دا نەیبڕیوە و كورتی نەكردۆتەوە تەنانەت بۆ تەنها جارێكیش.

بەلاّم لەم ڕۆژەدا دانان و درێژ كردنەوە ڕیش بۆتە شتێكی عەیبە ، خۆ ئەگەر كەمێك ڕیش دابنێی خێرا پێت دەڵێن بابە خۆ ئێرە ئەفغانستان نییە ، وەك بڵەی خوا ڕیشی بەس لەسەر ئەفغانی واجب كردبێت !

## • حوكمی دانان و درێژ كردنەوە ڕیش:

ئەوەی ڕاستە و هەق بێت (والله أعلم) ئەوەیە كە دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش واجبە و تاشینی حەرامە، وە دەست كاری كردن و كورت كردنەوەی هەر هەمان حوكمی هەیە.

لەسەر ئەمەش بەڵگەكان زۆرن، بەلاّم ئەوەی گرنگ بێت و زیاتر شیاوی باس كردن بێت دەیان كەینە پێش چاو:

## بەڵگەی یەكەم:

چەندەها فەرموودەی صەحیح مان هەیە لە (بوخاری) و (موسلیم)دا ، كە هەندێكیان هەر (متفق علیه)یە ، بێجگە لە سوننەكان و موسنەدەكەی ئیمام (ئەحمد) و پەرتوكەكانی دیكەی فەرموودە، كە تێیاندا هاتووە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمان دەكات بە دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش و لابردنی سمێڵ، كە فەرمانەكانی پێغەمبەری خوا بۆ واجبە و هیچ فەرموودەیەكی دیكەش نییە ئەو فەرمانە موطلەقە لابەرێت و بە فارمانێكی دیكە واجبێتی یەكە هەڵبگرێت یان هەڵبوەشێنێتەوە، لەو فەرموودانەش:

### فەرموودەی یەكەم:

عبداللّه ی كوری عومەر دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**خالِفوا المُشركين : وَفِّروا اللّحِي ، وَأحفوا الشَّوارِب** )).[1] واتە: پێچەوانە و موخالەفەی موشریكان بكەن، ڕیش بهێڵنەوە و ، سمیڵ كورت بكەنەوە)).

### فەرموودەی دووەم:

هەروەها ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : ((**جُزُوا الشَّوارِب ، وَأَرخوا اللّحى خالِفوا المَجوسَ**)).[2] واتە: سمێڵ كورت بكەنەوە و ، ڕیش بەردەنەوەو، پێچەوانەی مەجوسی یەكان (ئاگر پەرست)ەكان بكەن)).

---

[1] متفق علیه : رواه البخاری (5892) اللباس ، ومسلم (259) الطهارة .

[2] صحيح : رواه مسلم (260) الطهارة.

فەرموودەی سێیەم:

هەر ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**أنهَكوا الشَّوارب ، وَأعفوا اللِّحى**)).[3] واتە: سمێڵ لابەرن و مەیهێڵنەوە و ڕیش دابنێن و درێژی بكەنەوە)).

فەرموودەی چوارەم:

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (دە) شت فیطرەتی مرۆڤن ، لەوانە : ((**قص الشارب ، وَإعفاء اللحية**)).[4] لابردنی سمێڵ و دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش))...

ئەو دەستەواژانەی هاتوون لەبارەی فەرمان كردن بە دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش بە چوار جۆر هاتوون : ((**فِّروا اللحي... أرخوا اللحي ... أعفوا اللحي ... أوفوا اللحي**))...[5] ئەم دەستەواژانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی نابێت كە نابێت دەستكاری ڕیش بكرێت وهیچی لێ ببڕدرێت، جا چچای تاشینی !

فەرموودەكان زۆر هاتوون، ئێستا ناكرێت هەموویان باس بكەین، بەڵام دەڵێین :

## بەڵگەی دووەم:

تاشین و لابردنی ڕیش خۆ چواندن (شوبهاندن)ە بە بێ باوەرەكان، هەروەك لە فەرموودەكاندا هاتووە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**خالِفوا المُشركين**)) یان ((**خالفوا المَجوسَ**)) یان ((**خالفوا النصاری**))، وە بێ گومان موخالەفە كردنی كافران فەرزە

3) صحيح : رواه البخاری (5887) اللباس.

4) متفق عليه : رواه البخاری ومسلم.

5) رسالة فی صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم / للشيخ محمد بن صالح العثيمين .

لەسەر موسوڵمانان، بەتایبەت ئەگەر بە جیاواز فەرمانی لەسەر هاتبێت، هەروەها لەبەر گشت گیری فەرموودەكەی : (( **بُعِثْتُ بالسَيفِ بَيْنَ يَدَي الساعَة حَتى يُعبَدَ الله تَعالى وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَ جُعِلَ رِزقي تَحتَ ظلِ رُمحِي وَجُعِلَ الذُلَ والصَغارَ على مَن خالَفَ أمري، وَمَن تَشَبَهَ بِقَومٍ فَهوَ مِنهُم** )).[6] واتە: من نێردراوم بە پێغەمبەری خوا، كە هەتا دوا ڕۆژ بە شمشێر (سەیف) جەنگ و جیهاد و كوشتار بكەم، هەتا خوای گەورە بە تەنها بپەرسترێت ز شەریكی بۆ بڕیار نەدرێت، واتە هەتا بە تەواوەتی تەوحید و یەكتا پەرستی لەسەر ڕووی زەوی بەرقەرار دەبێت، وە ڕزق و ڕۆزیشم بۆ كراوەتە ژێر سێبەری نێزە (رمح)ەكەمەوە، واتە (فەیئو غەنیمەت)، وە هەركەسیش پێچەوانەم بكات لەم كارەدا و لەم ڕێگای من لابدات، تەنها ڕیسوای و زەلیلی بۆ دەمێنێتەوە، وە هەركەس خۆی بچوێنێت بە هەر گەل و هۆزێكی دیكەوە، ئەویش لەوانە، واتە لەمن نییە ))..

---

[6] صحيح: رواه احمد في المسند برقم (4944) و (4589) عن عبدالله بن عمر بن الخطاب القرشي، و رواه الطبراني في (مسند الشاميين) برقم (1211) ، و رواه البيهقي في (شعب الايمان) برقم (1198) ، و رواه (ابن شيبة) برقم في (المصنف) برقم (19006) و (19042) و (32361)، و رواه الطحاوي في (المشكاة الاثار) برقم (198) ، و رواه أيضا الامام (ابن المبارك) و (خطيب البغدادي) في كتاب (الجهاد و (الفقيه والمتفقيه) عن طاوس بن كيسان اليماني، وأيضا عن انس بن مالك بن نضر بن ضمضم البخاري، برقم (758)، و (104)، و صححه الالبانى رحمه الله في (صحيح الجامع الصغير للسيوطي برقم (2831) و (مشكاة الفقر) برقم (24) و (صحيح الجامع الصغير) برقم (2828) وقال الالبانى وهذا حديث صحيح و رجاله كلهم ثقات، و صححه شيخ المحدثين احمد شاكر المصري في تخريجه لكتاب مسند امام أحمد بن حنبل رحمهم الله تعالى أجمعين ....

[7] بەلأم لای یەهود تاشینی ڕیش كارێكی نا پەسەندە و دانانی كارێكی باشە ، وەك خۆیان دەڵێن پیاوەتی بە ڕیشەوەیە !/ پاشان دەڵێن لە تەوراتدا هاتووە پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێ بێت فەرموویەتی : ڕیش نیشانەی نێرینەیە ...

## بەڵگەی سێهەم:

دەست كاری كردن و لابردنی ڕیش، گۆڕین و دەستكاری كردنی خەلق و كاری خوای گەورەیە و، گوێڕایەڵی كردنی شەیتانی بەزیوە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ وَمَنْ يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا﴾ النساء: ۱۱۹) واتە : شەیتان دەڵێت دەبێ فەرمان بكەم بە ئادەمییەكان كە :شكڵ و بیچمی دروستكراوەكانی خوا تێك بدەن و بیگۆڕن، وەك : كوتانی خاڵ و، هڵگرتن و ڕیك كردنی برۆ و، شاش كردنی ددان و، تاشین و لابردنی موی سەر ڕوومەت (ڕیش) .....)).[8]

## بەڵگەی چوارەم:

هەروەها لابردن و دەست كاری كردنی ڕیش خۆ چواندنە بە ئافرەتان، وە پێغەمبەری خوایش نەفرەتی كردووە لەو كەسانەی خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتانەوە ، وە ئەو ئافرەتانەی خۆیان دەچوێنن بە پیاوانەوە، ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە (( **لَعَنَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم ألمُتَشَبهِينَ مِنَ الرِّجال بِالنِّساء، والمُتَشَبِّهات مِنَ النِّساء بالرَّجال**)).[9] واتە : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەفرەتی كردووە لەو پیاوانەی خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتانەوە و، لەو ئافرەتانەشی خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوانەوە)). **(لَعَنَ)** : واتە دوعای دورخستنەوەی لێ كردوون لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە.

---

[8]) هەرچەندە زۆرێك لە موفەسرین تەفسیری ئەم ئایەتەیان بە گۆڕینی دین كردووە، چونكە لە بنەڕەتدا خوای گەورە مرۆڤی لەسەر فیطرەتی ئیسلامەتی دروست كردووە.والله اعلم

[9]) متفق علیه : رواه البخاری (5885) كتاب اللباس ،و مسلم (259) الطهارة.

## بەڵگەی پێنجەم :

حەرامی تاشینی ڕیش ئیجماعی لەسەرە، واتە ئیجماعی هاوەڵان، لەسەر ئەمەش ئیبن حەزمی ئەندەلوسی و غەیری ئەویش نەقڵی ئیجماع یان كردووە كە هێشتنەوە و درێژ كردنەوەی ڕیش فەرزە و تاشینی حەرامە ، هەروەها شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت : (( وَيَحرُم حلقُ اللحيه )) واتە تاشینی ڕیش حەرامە.[10]

## وتەی شوێن كەوتوان و

## زانایانی هەر چوار مەذهەبەكەی ئەهلی سوننە لەم بارەوە

١- مەذهەبی ئەبو حەنیفە:

ئیمامی ئیبن عابدینی حەنەفی (رحمه الله) دەفەرموێت:((يحرم على الرجل قطع لحيته)) واتە : حەرامە لەسەر پیاو بڕین و دەستكاری كردنی ڕیشی)) ، هەر حەنەفی یەكان خۆیان دەگێڕنەوە ئیمامی ئەبو حەنیفە فەرموویەتی ڕیش حیجابی پیاوە .

٢- مەذهەبی مالیكی :

ئیمامی ئیبن عەبدولبەری مالیكی (رحمه الله) لە (التمهيد) دا دەفەرموێت:((يحرم حلق اللحية، ولا يَفعَلُهُ إلا المخنثون من الرجال)) واتە: تاشینی ڕیش و دەستكاری كردنی كارێكی حەرامە، وەهیچ كەس نایكات مەگەر پیاوی ژنانی و ناپیاو نەبێت)).

[10] الاختيارات الفقهية للالبانى (384).

٣- مەذهەبی شافعی:

ئیمامی ئیبن رەفعەی شافعی (رحمه الله) دەفەرموێت:((إن الامام الشافعی رحمه الله قد نص في الام على تحريم حلق اللحية)) واتە: ئیمامی شافعی لە پەرتوكی (الام) دا فەتوای لەسەر حەرامی تاشینی ڕیش داوە )).

٤- مەذهەبی حەنبەلی :

ئیمامی سەفارینی حەنبەلی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((المعتمد في المذهب حرمة حلق اللحية)) واتە: ئەوەی لە مەذهەبی حەنبەلی دا موعتەمەدە ئەوەیە تاشینی ڕیش حەرامە)).

هەر ئیمامی ئیبن موفلحیش (رحمه الله) دەفەرموێت:(( وذكر ابن حزم رحمه الله الاجماع أن قص الشارب، وإعفاء اللحية فرض)) واتە: ئیبن حەزمی ئەندەلوسی رەحمەتی خوای لێ بێت نەقڵی ئیجماعی كردووە كە لابردن و بڕینی سمێڵ و، دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش فەرزە )).

ئیمامی نەوەوی (رحمه الله) دەفەرموێت :((كره لنا قصها كفعل الأعجام، وكان من ذي كسرى قص اللحي و توفير الشوارب)) واتە: لای ئێمە دەستكاری كردنی ڕیش كەراهەتی هەیە، وەك كار و كردەوەی ئەعجەمی یەكان، وە لە كار و كردەوەی كیسرای ڕۆم بوو لابردنی ڕیش و درێژ كردنەوی سمێڵ))[ترتر] هەڵبەتە لای ئیمامی نەوەوی بەكار هێنانی دەستەواژەی (كەراهەت) بۆ حەرامە.

[11] فقه المسلم والمسلمة / محمد حسين (ص 15).

# پوچەڵ كردنەوەی هەندێك وتە و گومانی نا پەسەند لەم بارەوە

بزانە: پاش ئەوەی بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و ئیجماعی هاوەڵان و وتەی پێشینان و فەرمانی مەذهەبەكان بۆمان دەركەوت و زانیمان كە تاشین و دەستكاری كردنی ریش كارێكی حەرامە، وە دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش فەرزێكی شەرعییە، ئیتر پێویست بە موجادەلە ناكات لەبارەیەوە، بەڵام هەندێك شت هەیە كە بۆتە گومان لای خەڵكی لەبارەی دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش، هەتا بە جۆرێك ئەو گومانانە وای لە لایەكی ئەم ئومەتە كردووە كە ڕیش بتاشن! ، ئێمەش بە فەزڵی خوا لەم باسەدا هەندێك لەو گومانانە دەڕەوێنینەوە و راستی یەكان ئاشكرا دەكەین :

## گومانی یەكەم:

بەڵگە هێنانەوە و كاركردنی زۆرێك لە خەڵكی بە فەتوایەكی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە كە لە پەرتوكی ((اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم)) لە موخالەفە كردن و پێچەوانەی بێ باوەران لە ڕێچكەی ڕواڵەتی یان فەرموویەتی:

(( لو أن المسلم بدار حرب أو دار كفر غير حرب لم يكن مأمورا بالمخالفة لهم في الهدي الظاهر لما عليه في ذلك من الضرر بل قد يستحب للرجل أو يجب عليه أن يشاركهم أحيانا في هديهم الظاهر إذا كان في ذلك مصلحة دينية من دعوتهم إلى الدين والإطلاع على باطن أمرهم لإخبار المسلمين بذلك أو دفع ضررهم عن المسلمين ونحو ذلك من المقاصد الصالحة. فأما في دار الإسلام والهجرة التي

أعز الله فيها دينه وجعل على الكافرين بها الصغار والجزية: ففيها شرعت المخالفة ))[12]. واتە: ئەگەر موسوڵمان لە خاكی جەنگ یان خاكی كوفار دا دەژیا و شەر و كوشتاری تێدا نەبوو، ئەوە فەرمانی پێ نەكراوە كە پێچەوانەیان بێت لە هەندێك ڕێچكەی ڕواڵەتی دا، ئەگەر ببێتە مایەی زەرەر و زیان بۆی، بەڵكو لەم كاتەدا موستەحەبە بۆ پیاو یان واجبە لەسەری كە هەندێك جار بەژدارییان بكات لە هەندێك ڕێچكەی ڕواڵەتی یاندا، ئەگەر لەم كارەیدا سودێكی ئاینی تێدابێت لە بانگەواز كردنیان بۆلای ئاین و چاكە كاری لەسەر ناوەرۆكی هەوالی موسوڵمانان بەو كارە، یان دوور خستنەوە و لابردنی زەرەر و زیانێك لەسەر موسوڵمانان، و لەو جۆرە مەبەست و مەصڵەحەتانە، بەلاَم لە خاك و داری ئیسلام و هیجرەت دا، كە خوای گەورە ئاینەكەی تێدا بە عیزەت كردووە (واتە فەرمان رەوا) و بێ باوەرەكانی بچوك و لاواز كردووە و كردونیەتە ژێر جزیە و تەكلیفی فەرمان رەوایانی موسوڵمان، ئەوە بێ گومان سەرپێچی كردن و لادان و پێچەوانە كردنیان لەو ڕێچكە ڕواڵەتی یانە فەرزە)).

## پێیان دەڵێین:

به تەوفیقی خوای گەورە:

## یەكەم:

پێش هەموو شتێك لەو كەسانەی ئەم فەتوا تەئویل دەكەن دەپرسین : ئایا شێخی ئیسلام فەرموویەتی ئەگەر لە خاكێكدا بوون و،

[12] اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم/ لابن تيمية رحمه الله (ص 176–177).

بیّ باوەران چییان دەكرد ئێوەش وەك ئەوان بكەن؟ ئەگەر چی ئەو كارەش پێچەوانەی ئەصل و ئوصولی شەریعەتیش بێت !؟

## وەلام:

بیّ گومان شێخی ئیسلام لەم وتەیە بەریئە، بەڵكو ئەمە بوهتانە و بە دەمییەوە دەكرێت، چونكە شێخی ئیسلام لەم وتەیەدا بە راستەوخۆ ئاماژەی نەكردووە كام ڕێچكەیە لە شەریعەتی ئیسلام جێبەجیّ نەكرێت و چاو لەكام ڕێچكەیەی بیّ باوەران بكرێت، ئیتر چۆن دەڵێن: مەبەست پێی تاشینی ڕیشە، لەگەڵ ئەوەدا هەر خۆی دەفەرموێت : ((ویحرم حلق لحية )) واتە تاشینی ڕیش حەرامە.سمتر،پاشانیش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ((مَن تَشَبَهَ بِقَومٍ فَهوَ مِنهُم))، خۆ هەر شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە خۆی دەفەرموێت: ئەم فەرموودە هەرچەند ڕواڵەتەكەی بۆ كوفرە ، بەڵام ئەهوەن ترین حوكمی بۆ حەرام كردنە !

## دووەم:

پاشان گریمان شێخی ئیسلام لەم وتەیدا مەبەستیشی ڕیش بووە، بەڵام بۆچی دەبێت بتاشرێت؟ ئایا لەبەر خۆ چواندن بە ئافرەتان و بیّ باوەرانەوە و سەرپێچی كردنی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەری خوداو لادان لە فیطرەت و سروشتی مرۆڤایەتی، یان لە بەر مەترسی زەرەر و زیانی بیّ باوەران ؟

[13]) الاختيارات الفقهية للالبانى (384).

## وەلاّم :

ئەگەر شێخی ئیسلام وایشی فەرموو بێت، ئەوە مەبەستی پێی ئەوە نەبووە موسوڵمانان پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەی بكەن، بەڵكو مەبەست پێی (دفع أعظم الضررين) بووە، وەك لە وتەكەیدا بە ئاشكرا فەرموویەتی، چونكە ئەگەر موسوڵمانان لە خاكێكدا بیانەوێت جیهاد بكەن و شەڕ بكەن و بزانن بەهۆی دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش توشی زیان و گرتن دەبن ، ئەوە بۆیان دروستە ڕیشیان بتاشن، ئەویش لەبەر ئەو ئەوەی شتێكی گرنگتر لەپێش ئەمەوەیە، وەك ئەوەی صەلاحەدینی ئەییوبی بە سەربازەكانی كرد.

ئیبن كەثیر (رحمه الله) لە پەرتوكی (البدايه والنهايه) دا ، لەبارەی گەمارۆی سوپای خاچ پەرستەكان بۆسەر شاری (عەككا).[14]
لەسەردەمی صەلاحەدینی ئەیوبی دا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:
لەو سەردەمەدا كە هیچ هۆكارێك نەبوو كە (سەفینە) كەشتی یارمەتی بێت بۆ موسوڵمانان و ڕزگاریان بكات لەو گەمارۆیە، تەنها بەهۆی تاشینی ڕیش و پۆشینی جل و بەرگ و پۆشاكی ڕۆمی یەكان نەبێت، صەلاحەدینی ئەییوبی فەرمانی كرد بە هەندێك لە بازرگانەكان كە پۆشاكی خاچ پەرستەكان بپۆشن و ڕیشیان بتاشن، و لەناو كەشتی یەكانیاندا هەندێك بەراز لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن و ، بە پۆشاكی ئاوریشم خۆیان بڕازێننەوە ، هەتا سەربازە ڕۆمییەكان گومانیان لێ نەكەن كە ئەمانە موسوڵمان و پێداویستی موسوڵمانانیان

---

[14] عەككا : شارێكە دەكەوێتە سەر كەناری دەریای سپی ناوەراست، كە یەكێكە لە شارەكانی فەلەستین، كە یۆنانییەكان ئەم شارەیان ناو نا (بتۆڵیمایس) .

هەڵگرتووه.[15] / صەلاحەدینی ئەییوبی كاتێك ئەم فەتوای دەركرد بۆ سوپاكەی كە پێویستییەكی زۆریان بە چەك و ئازوقە بوو، وە ڕێڕەوی جیهادیش بەردەوام نەدەبوو تەنها بەو كارە نەبووایە ...

پاشان ئەو كەسانەی ڕیش دەتاشن و ، تەئویلاتی بۆدەكەن ئایا لە موهیمەیەكی جیهادی وادان تا فەتواتان بۆ بدرێت وەك صەلاحەدینی ئەییوبی فەتوای دا بە پیاوانی بازرگان لەبەر هێنانی چەك و پێداویستی و ئازوقە خۆیان بچوێنن بە سەربازەكانی ڕۆمەوە و ڕیش بتاشن و پۆشاكی ئەوان بپۆشن !؟

بێ گومان نەخێر، ئەوانەی ئەم جۆرە قسانە دەكەن هەرگیز لە بەرەكانی جەنگ و جیهاد دا نین، بەڵكو بەناوی بانگەواز و دەعوەوە هەموو شتێك بۆخۆیان دەشەرعێنن، خۆ ئەگەر لە بەرەكانی جەنگ و جیهاد دا بونایە، دەمانووت لەبەر ئەو موهیمەیە بەناچاری دروست بوو ڕیشتان بتاشان، وەك شێخی مەقدسی (ئەبو محمد ئەلمەقدسی) فەتوای بۆ موجاهیدان داو فەرمووی:((فلا بأس للمجاهدين من أن يأخذوا من لحاهم أو أن يسبلوا من إزارهم إذا كان الجهاد لا يستمر إلا بذلك وإذا كان في ذلك تورية عن المجاهدين ودرء مفسدة اعتقالهم والتسلط عليهم)) واتە: هیچی تێدانی یە بۆ موجاهیدان ئەگەر ڕیشیان كورت بكەنەوە یان لای بەرن و، پۆشاكەكانیان درێژ بكەنەوە، ئەگەر جیهاد و شەر كردن بەردەوام نەبێت بەبێ كردنی ئەو كارە، وە ئەگەر لەو كارەشەدا پارێزگارییەك بۆ گیانی موجاهیدان و دورخستنەوەی زەرەرێك هەبێت، لە گرتنیان و سەركەوتن بەسەر یاندا)).

---

[15]) البداية والنهاية للحافظ ابن كثير رحمه الله (ج12/ ص 243).

## سێهەم :

باشە ئەگەر دەڵێن : ناتوانین ڕیش دابنێین لە ترسی حاکم و دەسەڵاتدارەکان، ئەوە هەر خۆتان ، خۆتان بە درۆ دەخەنەوە، چونکە زانایان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون ئەگەر لە خاکێکدا مرۆڤی موسوڵمان نەتوانێت شەعائیرێك لە شەعائیرەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات ئەوە هیجرەت و کۆچ کردن لەو خاکە واجب دەبێت، ئەی ئەگەر وایە ئێوە چۆن دانیشتون لەو خاکەدا کە ڕێگری دانان و درێژ کردنەوەی ڕیشتان لێ دەکەن !؟

## چوارەم :

گومانێکی دیکە کە خەڵکانێکی دیکە کاری پێ دەکەن ودەیکەنە بەڵگە، مەصلەحەتی دەعوەیە، دەڵێن ئەگەر ڕیش دابنێین و درێژی بکەینەوە کەس گوێمان لێ ناگرێت ونایەت بەدەم بانگەوازەکەمانەوە !

## وەلاّم :

دەپرسین: ئایا ئێوە بانگەواز بۆ خوای گەورە دەکەن؟ ئەگەر وتیان بەڵێ ، دەڵێین باشە خوا پاداشتی خێرتان بداتەوە، پاشان دەپرسین ئەی کێ بۆتان دیاری ئەکات چۆن چۆنی بانگەواز بکەن؟ ئەگەر وتیان هەر خوای گەورە. دەڵێین : الحمدلله، پاشان دەپرسینەوە باشە خوای گەورە فەرموویەتی : لەبەر خاتری دەعوە و بانگەواز خۆتان بکەنە تاوان و سەرپێچی منەوە؟ ئەگەر وتیان : نەخێر هەر دەڵێینەوە الحمدلله، پاشان دەپرسینەوە: ئایا مرۆڤی موسوڵمان دەبێت لە پێشدا فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی لە خۆیدا جێبەجێ بکات پاشان بانگەوازی خەڵکی بکات، یان خۆی لە ئەصل و ئوصوڵی شەریعەتەکەی

داماڵێت و وەك كەسێكی فاسیق بانگەوازی خەڵكی بكات؟ ئەگەر وتیان دەبێت قورئان و سوننەت لە خۆیدا جێبەجیٚ بكات پاشان بانگەوازی خەڵكی بكات....، لێیان دەپرسینەوە: ئایا ئەگەر دەبێت قورئان و سوننەت لە خۆیدا جێبەجیٚ بكات پاشان بانگەوازی خەڵكی بكات، ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵە بەرێزەكان و ئەوانی دوای ئەوانیش لەبەر خاتری بانگەواز و دەعوە ڕیشی خۆیان تاشی و سەرپێچی خوای گەورەیان كرد؟ ئەگەر وتیا نەخێر هەرگیز شتی وایان نەكردووە، ئەوە پێیان دەڵێین: ئەی ئێوە چۆن ڕیش دەتاشن و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی و ئیجماعی هاوەڵەكان دەكەن، ئایا هەدی ئێوە خێر ترە یان هەدی پێغەمبەری خوا كە هەموو كاتێك دەیفەموو: (( **وَ خَیر الهدي هدي محمد** )). ئەگەر وتیان هەدی محمد (صلی اللّه علیه وسلم) ، ئەوە پێیان دەڵێیینەوە : دە ئیتر چەواشە كاری بەسە، مل دانەوێنن بۆ حەق ، چونكە خوای گەورە حەقە و حەقی خۆش دەوێت.

## پێنجەم :

پێم خۆشە خاڵی پێنجەم بەو فەتوای شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە كۆتایی پیٚ بێنم، كە لە پەرتووكی (اقتظاء الصراط المستقیم) دا نووسیویەتی، هەر ئەو پەرتوكەی كە ئەو دڵ نەخۆشانە دەیكەنە بەڵگەی ئەو كارە خراپەیان و، وشە لە باسەكەی خۆی دەشێوێنن، وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ **يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ** ﴾ المائده 3)

شێخی ئیسلام لە باسی ((المشابهة تُورِثُ مَوَدَة وَ مَحَبَة ولا بُد)) واتە: خۆ چواندن و شوبوهاندن خۆشەویستی و مووالات بۆ یەكتر دروست دەكات و بەرهەم دەهێنیٚ)).

دەفەرمووێت :

(( أن المشابهة في الظاهر تُورِثُ نوع مودة و محبة في الباطن، كما أن المحبة في الباطن تورث المشابهة في الظاهر)).. واتە : خۆ چواندن و شوبهاندن لە ڕواڵەت و ڕووكەشدا، جۆرێك لە خۆشەویستی و مەوەدەت و مووالات لە ناخدا بەرامبەر بە یەكتری دروست دەكات، وەك چۆن خۆشەویستی ناخ خۆچواندن و شوبهاندن لە ڕواڵەت و ڕووكەشدا بەرهەم دەهێنیٚ و دروست دەكات))..

هەروەها دەفەرمووێت :

(( أن مشاركتهم في الهدي الظاهر: توجب الاختلاط الظاهر، حتى يرتفع التمييز ظاهرا بين المهديين المرضيين، وبين المغضوب عليهم والضالين، إلى غير ذلك من الاسباب الحكمية)).واتە: خۆ چواندن و بەژداری كردن لە ڕێچكەی ڕواڵەتییەكاندا، تێكەڵی ڕواڵەتی دروست دەكات یان واجب دەكات، هەتا جیاوازی كردن لە نێوان شوێن كەوتوانی ڕێگای هەق و شوێن كەوتوانی ڕێگای یەهود و نەصارا نامێنێت و هەڵدەگیردرێت ))…. وە دەفەرمووێت: ((فموافقتهم فيه موافقة في نوع من انواع ضلالهم و معاصيهم)). واتە : ڕازی بوون و یەكگرتن جۆرێكە لە لە ڕازیبون و یەكگرتن لە جۆرێك لە جۆرەكانی سەرلیٚ شێواوی و تاوانەكانیان)).

ئەوەتا شێخی ئیسلام زۆر بە ڕوونی و ئاشكرا لەم بارەوە دەدوێت، ئیتر تەئویلاتی چی بۆ قسەكانی دەكەن ؟!/ ئەوانەی كە ئەم پەرتووكە

دەكەنە بەڵگە. باتەواوی بابەتەكانی دیكەی ناویشی بەباشی بخوێننەوە پاشان بێن و قسەی لەسەر بكەن (**أثبتوا العرش ثم انقشوا**) ...
لە كۆتاییدا دەڵێین :

**هذه الكفاية    لمن أراد الهداية**

ئیتر با واز لە موجادەلە و شوبوهات بهێنین لەسەر فەرمانی خوای گەورە ، چونكە ئەمە پیشە و كاری مونافیقانە و، كاری باوەڕداران نییە، چونكە كاری باوەڕداران بەرامبەر فەرمانی خوای گەورە بەو جۆرەیە كە دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ** ﴾: النور: ٥١ – ٥٢).

**پرسیارێكی گرنگ ئایا ئەگەر ڕیش لە ئەندازەی مستێك تێپەڕی كرد دروستە ببڕدرێت ؟**

هەندێك لە زانایان بۆ ئەوە چون ئەگەر ڕیش لە ئەندازەی مستێك یان قەبزە (القبضة)یەك زیاتر بوو دروستە ببڕدرێت، واتە ئەگەر مرۆڤ ڕیشی گرت و پڕاو پڕی دەستی تێپەڕی كرد، لەسەر ئەوەش فەرموودەكەی ئیبن عومەر یان كردووە بە بەڵگە، كە دەگێڕنەوە : ((**إنهُ كان إذا حَجَ أو اعتَمَرَ قبض على لحيته** )).[16] واتە ئیبن عومەر حەج یان عومرەی بكردایە ئەوە ڕیشی بە مستی دەگرت و چی لەوە زیاتر بوایە دەیبڕی)).

ئەوانەی ئەم كارەیان پێ بەسەندە دەڵێن : ئیبن عومەر خۆی ڕیوایەت كاری زۆربەی ئەو فەرموودانەیە كە تێیدا پێغەمبەری خوا فەرمان بە دانان و درێژ كردنەوەی ڕیش دەدات، دەی كەوابێت هەر خۆی شارەزا ترە بەو كارە .

[16]) **متفق عليه** : رواه البخاري (5892) اللباس ، ومسلم (259). الطهارة

بەلاَم ئەم لێكدانەوە بەلای هەندێكی دیكە یان زۆرینەی زانایانەوە پەسەند نییە و نابێتە بەڵگە بۆ لابردنی ڕیش لەو ئەندازە هەموو كاتێك، ئەویش لەبەر چەند هۆكارێك:

١- ئیبن عومەر كاتێك كۆتایی بە ئیحرامی حەج و عومرە دەهێنا ئەم كارەی دەكرد، بەلاَم ئەمانە هەموو كاتێك دەیكەن.

٢- ئەم كردەوەی ئیبن عومەر لێكدانەوە و تەئویلی ئەو ئایەتەی حەجە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ الفتح: ٢٧) واتە : بە ئیزنی خوای گەورە دەچنەوە مزگەوتی حەرام (بۆحەج) بەسەلامەتی و بێ ترس و دڵە ڕاوكێ، وە كاتێكیش دەچنە ئیحرامی حەجەوە سەرتان تاشیوە و ئافرەتانیشتان كورتیان كردۆتەوە)).ئەمەش بەلای ئەوانەوە وەك چاك كردنی سەر ، كورت كردنەوەی ڕیشیش سوننەتە.

٣- ئەگەر هاوەڵێك بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەی ڕیواتی كردوە ڕەفتاری كرد، ئەوە كار و حوكمی شەرعی لە فەرموودەكەوە وەردەگیردرێت نەك لە لەكار و تێگەیشتنی ئەو هاوەڵە، چونكە كار پێ كردن و وەرگرتنی ئەحكامی شەرعی لە پێغەمبەری خوداوە وەردەگیردرێت، واتە ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو (مەرفوع) بێت ، نەك بۆلای فەهم و كاری ڕاوییەكەی، واتە (مەوقوف) بێت !

واللّه أعلم: صەواب ئەوەیە كە هێشتنەوە و دەستكاری نەكردنی ڕیش واجبە، لەبەر كاركردن و پشت بەستن بە گشت گیری هاتنی فەرمانەكان لە فەرموودەكاندا بە ((**أعفوا ... أرخوا ... وفروا ... أوفوا** )) وەك كۆمەڵی زانایان بریار یان لەسەر داوەو و لەسەری پێك هاتوون.

خوای گەورەش لە هەمووان زاناترە.

# باسی دووەم

## دانان و درێژ كردنەوەی سمێڵ ( الشارب )

وەك سەرەتا باسمان كرد زۆربەی موسوڵمانان ئەمڕۆ ڕیشیان پاك دەتاشن و چەپكی سمێڵ دادەنێن، ئەمەش هەر چەندە پێچەوانەی خولوقو فیطرەتە، حەرامە و پێچەوانەی سوننەتە، چونكە لە چەندەها فەرموودەی صەحیح دا هاتووە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی كردووە بە لابردن و بڕینی سمێڵ و دانان و درێژ كردنەوە ڕیش.

ئەوەتا ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی :

((**خالِفوا المُشركِين : وَفِّروا اللِّحِي ، وَأَحفوا الشَّوارِب**)).[17] واتە: پێچەوانە و موخالەفەی موشریكان بكەن، ڕیش بهێڵنەوە و، سمیلٚ كورت بكەنەوە)).

هەر ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**أنهَكوا الشَّوارب ، وَأعفوا اللِّحى**)).[18] واتە: سمێڵ لابەرن و مەیهێڵنەوە و ڕیش دابنێن و درێژی بكەنەوە)).

وەئاشكراشە لە ڕووی زمانەوانی یەوە وشەی ((**نهك**)) بۆ ((**الانهاك**))ە واتە زیادە ڕۆی كردن لە لابردن و بڕینی سمێڵ.

هەروەها زەیدی كوری ئەرقەم دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : ((**من لم يأخذ شاربه فليس منا**)).[19] لە ئێمە نییە ئەو

---

[17] متفق عليه : رواه البخارى (5892) اللباس ، ومسلم (259) الطهارة .

[18] صحيح : رواه البخارى (5887) اللباس.

[19] صحيح : رواه احمد و الترمذى والنسائى ، وذكره ابن قيم في زاد المعاد (ج1) وصححه الالبانى فى السلسلة الصحيحة و مشكات المصباح (4438).

**کەسەی سمێڵی لێ نەکاتەوە)). هەروەها خاتو عائیشە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : (دە) شت لە نەریت و سروشتی مرۆڤە ، لەوانە: ((قص الشارب)). واتە : لابردن و بڕینی سمێڵ)).**[20]

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**






[20]) **خوینەری خۆشەویست :ڕەنگە من بەم باسەدا بەگشتی حەقی تەواوەتیم نەدابێت بەم باسە، چونکە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، بەڵام لێرەدا زۆر دەرفەتی باسکردنی ئەم شتەمان نییە- بۆیە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ چەند پەرتوکێکی دیکەی شەرعی لەم بارەوە ، لەوانەش : پەرتوکی _ (فتاوى الناس ، نوسنی مەحمود ئەلمصری) و (تحذير الساجد من اخطاء العبدات والعقائد، هەر نوسنی مەحمود ئەلمصری) و پەرتوکی ((اشعار الحريص على عدم جواز التقصيص لمخالفته للتنصيص/ کە شێخی مەقدیسی پێدا چونەوەی بۆ کردووە)) و پەرتوکی (الحلال و الحرام في الاسلام، نوسینی شێخ عوسێمین) و پەرتوکی (فقه المسلم والمسلمة، نوسنی محمد حسين، دار الدعوه) و (الاختيارات الفقهيه، دانانی شێخ ئەلبانی) و (تمام المنه على فقه السنه، هەر دانانی شێخ ئەلبانی)یە و (شەرحی صەحیحی بوخاری دانانی شێخ عوسێمین کە لەباسی شەرحی فەرموودەی ژمارە 5892 دا بە تەفصیل باسی لەم مەسەلە کردووە) لەگەڵ هەندێك پەرتوکی دیکەی دکتۆر عبدالله عزام لەم بارەوە .**